# ڕێچکەکانی

# سەرکەوتن

شێخ ئەبو حەمزەی موهاجیر (الله لێی وەرگرتبێت)

## بەشی 2



پێی خۆشە ئاسانە بە یارمەتی الله.

وە زۆرترین شت کەوا ئاگاداری لێبکەینەوە گوناە و تاوانە لەجەنگ بەڕاستی سزا و سەختیەکانیمان تاقی کردەوە لە چەندین شوێن بەردەوام هۆکار بوو بۆ زۆر لە هاوار و ناخۆشیەکان.

ئەوە ڕەسول الله یە صلّے اللّه علیه وسلّم لە سوپای هاوەڵان لە ئوحد شوێنی بۆ هەموو کۆمەڵە سەربازەکان دیاری کرد وە تیرئەندازەکانی لە شوێنێك دانا کەوا پشتی موسڵمانان بپارێزن لە سوڕانەوەی دوژمنان یان پێشڕەوی بکەن لەسەرەو، وە زۆر بەجوانی و ڕێکی پێی ڕاگەیاندن: ((پشتمان بپارێزن ئەگەر ئێمەتان بینی کەوا دەکوژراین سەرمان مەخەن و شوێنتان چۆڵ مەکەن وە ئەگەر بینیتان دەست کەوت کۆدەکەینەوە بەشداری مەکەن لەگەڵمان و بمێننەوە لە شوێنی خۆتان)) [أحمد گێڕاویەتەوە لە ابن عباس]، تیر ئەندازەکان گوێڕایەڵی ئامۆژگاریەکەی ڕەسول الله یان نەکرد صلّے اللّه علیه وسلّم کە لە ئەنجامی ئەوەدا بوە هۆی دۆڕانی موسڵمانان وە ژمارەیەکی زۆر کوژران بەهۆی تاوانی کۆمەڵەیەك لە سوپا لەگەڵ ئامۆژگاری کردن و ئاگادار کردنەوەیان لەلایەن ئەمیرەوە.

ئەوە بەڵگەیە بۆ ئەوەی کەوا سزای تاوانی گوێڕایەڵی نەکردنی سەربازی خێرایە، وە هەر ئیجتیهادێکی سەربازێك کەوا پێچەوانەی فەرمانی ئەمیرەکە بێت هەر چەندە لە ڕوکەشدا جوان و چاك بێت ئەوە هەڵەیەکی گەورەیە و کردنەوەی دەرگایەکی شەڕی گەورەیە. سەرباز عیبادەتی الله دەکات بە گوێڕایەڵی بۆ ئەمیرەکەی ئەگەر فەرمانی پێنەکات بە شتێك کەوا پێچەوانەی شەرع بێت.

هەرچی ئیجتیهادی جوڵانەوەی سەربازیە ئەوە مافی بەتەنهای ئەمیرە بۆت نیە لێی دەرچی مەگەر لە بابەتی واجب بوونی ئامۆژگاری نەبێت، لەبەر ئەوەی قاعیدەکە دەڵێت: ”فەرمان ووتەی پێشەوا یان ئەمیر ناکرێت هەڵبوەشێندرێتەوە بە وتەی یەکێك لە موسڵمانان کەوا بیردۆزەکەی و بیرۆکەکەی پێچەوانەی ئەمیر بێت” [ابن مفلح: کتاب الفروع]. کۆتایی هات.

ئەی بەندەی الله سەیری بەخششی گوێگرتن و گوێڕایەڵی بکە لە ناخۆشی و قورسی، ئەوە ڕەسول الله یە صلّے اللّه علیه وسلّم فەرمانی کرد بە بریندارە موسڵمانەکان کەوا لە ئوحد بەژدار بوون دەرچن هەرچەندە ئازار و برینیان هەبوو ئەوەش لەکاتێك دا بوو کەوا ابو سوفیان دەیویست کەوا بگەڕێتەوە بۆ ئەوانەی مابوون لە سوپای موسڵمانان وەڵامیان داوە گوێڕایەڵی الله و ڕەسولەکەیان کرد، الله تعالی دەفەرمووێت: ﴿ئەوانەی وەڵامی الله و ڕەسولەکەیان داوە دوای ئەوەی کەوا توشی برینداری بوون بۆ ئەوانەیان کە چاکەیان کردو پارێزکار بوون، پاداشتی زۆر گەورە و بێ سنوور ئامادەیە...﴾ [آل عمران: 172].

سێەم: گوێگرتن و گوێڕایەلی وەکو جێبەجێکردنی فەرمانی الله.

اللّه تعالیٰ دەفەرمووێت: ﴿یادی ئەو نیعمەتانەی الله بکەن وە یادی ئەو پەیمانە بکەن کەوا لەگەڵ الله گرێتان دا کاتێك وتتان بیستمان و گوێڕایەڵ وبەرفەرمانین﴾ [المائدة: 7]. لە عبادە وە الله لێی ڕازی بێت دەڵێت: ((بەیعەتمان دا بە پێغەمبەر صلّے اللّه علیه وسلّم لەسەر گوێگرتن وگوێڕایەڵی لە چالاکی و لە ناخۆشی لە قورسی و ئاسانی وە با پێشمان ناخۆش بێت وە ناکۆکی ناکەین لەگەڵ خاوەنی ئەو فەرمانە تا کوفرێکی رونی لێنەبینین کەوا بەڵگەمان پێبێت لەلای اللّه)) [بوخاری و موسلیم گێڕاویانەتەوە]. لە گێڕانەوەیەکی تر: ((لەسەر گوێڕایەڵی و گوێگرتن لە چالاکی و تەمبەڵی)). وەفەرمووی: ((گوێبیست بن و گوێڕایەڵ بن ئەگەر بەندەیەکیش کرا بە فەرمانڕەوا بەسەرتان کەوا بە قورئان بەڕێوەتان ببات)) [موسلیم لە أم الحصین ی گێڕاوەتەوە].

الحافظ ابن حجر لە فتح الباري لە فەرموودەی بابەکە دەڵێت: فەرمان بە گوێڕایەڵی بۆ هەموو ئەمیرێکە با پێشەواو ئیمامیش نەبێت.

وە صلّے اللّه علیه وسلّم دەفەرمووێت: ((من فەرمانتان بە پێنج شت پێدەکەم کەوا الله فەرمانی پێکردوم: کۆمەڵ، گوێگرتن و گوێڕایەڵی، هیجرەت و جیهاد)) [أحمد و الترمذي لە الحارث الأشعري گێڕاویانەتەوە].

ئەوەی دەمەوێت تەئکیدی لەسەر بکەمەوە لێرەدا ئەویش ڕاستگۆییە لە گوێڕاگرتن و گوێڕایەڵی و بەهێزی گوێڕایەڵی فەرمانەکانی اللّه تعالی یە لە ناخۆشی و قورسی لەبەر ئەوەی کەوا گوێڕایەڵی لە وەی بەندە

ئەوە حاڵیان بوو بەتەواوی کاتێك لە غەزوەی ئەحزاب گەڕانەوە دوای ناخۆشی، دڵخۆش بوون بە نیعمەتی ئەمان، تۆز و خۆڵیان پاك نەكردەوە لە جەستەیان دوای ئەو گەمارۆیە درێژە، کەوا فەرمان دەرچوو بە غەزوەیەکی تر و بە خێرایی و فەرمووی: ((هیچ کەسێك نوێژی عەسر نەکات تا دەگاتە بني قريظة)) [بوخاری و موسلیم گێڕاویانەتەوە لە ابن عمر].

وەڵامی فەرمانی الله ورەسولەکەیان داوە کەواسەرکەوتنیان بۆ هات لەبەر ڕاستگۆیی گوێگرتن و گوێڕایەڵیان و بەهێزی وەڵامدانەوەیان بۆ فەرمانی الله.

لە ابو هورەیرەوە الله لێی ڕازی بێت هەروەکو لە هەردوو صەحیحەکە هاتوە دەفەرموێت: ((ئەوەی گوێڕایەڵی من بکات گوێڕایەڵی الله ی کردوە وە ئەوەی کەوا بێ گوێی من بکات بێ گوێی الله ی کردوە وە هەرکەسێك گوێڕایەڵی ئەمیری کرد ئەوە گوێڕایەڵی منی کردوە وە ئەوەی بێ گوێی ئەمیری کرد بێ گوێی منی کردوە)). وە لە نمونەی گوێڕاگرتن و گوێڕایەڵی ئەمیر ئەمانەن:

یەکەم: گومان بردنی جوان بە ئەمیر.

الله تعالیٰ دەفەرمووێت: ﴿ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە دورکەونەوە لە زۆربەی گومانەکان چونکە هەندێك گومان تاوانە﴾ [الحجرات: 12].

ئەگەر گومانی چاك بردن بە عەوامی موسڵمانان واجب بێت ئەوە بۆ ئەمیر ئەولاترە، هیچ شتێك زیان ناگەیەنێت بە جیهاد ئەوەندەی گومان بردنی خراپ تێکی دەدات چۆن وانابێت لەکاتێکدا کەوا درۆترین وتەیە صلى الله عليه وسلم دەفەرمووێت: ((نەکەن گومان ببەن گومان بردن درۆترین گفت و وتەیە)) [بوخاری و موسلیم گێڕاویانەتەوە لە أبو هريرة].

خاوەنی فیضُ القدیرِ دەڵێت: ئەوەی گومانی خراپی برد بەکەسێك کەوا شیاوی ئەو گومانە نەبوو ئەوە بەڵگەیە لەسەر خراپی خۆی وەکو دەوترێت: ئەگەر بۆخۆت خراپ بووی گومانەکانت خراپ دەبن.

دووەم: ڕێزگرتنی ئەمیر.

لە عبدالله کوڕی عمرو کوڕی العاص لە موعازەوە ووتی: ((ڕەسوڵ الله صلى الله عليه وسلم پەیمانی ئەوەی پێدایین کەوا الله واجب دەکات لەسەرە خۆی کەوا ئەگەر پێنج کار هەن هەرکەسێك بیانکات ئەوە بۆخۆی دەیپارێزێت ئەوانیش: ئەوەی سەردانی نەخۆش بکات، یان دەرچێت لەگەڵ مردوو کاتێك دەیبەن بۆ گۆڕستان، یان جیهاد بکات لە ڕێی الله، یان بچێت بۆ لای پێشەوا و شکۆ و ڕێزی ئەوی بوێت، یان لەماڵی خۆی دابنیشێت و خەڵك لێی سەلامەت بن و ئەویش لە دەست خەڵك سەلامەت بێت)) [أحمد گێڕاویەتەوە].

ڕێز گرتنی ئەمیر بە گوێرگرتن وگوێڕایەڵی کردنی دەبێت، وە بەباسکردنی دەبێت بە چاکی و پێشبڕکێکردن دەبێت بۆ گوێڕایەڵی فەرمانەکانی و ئامۆژگاری کردنی لە پەنهانی.

الحافظ ابن حجر لە فتح الباري ئەوەی گواستۆتەوە: ئامۆژگاری کردنی پێشەواکانی موسڵمانان بریتیە لە یارمەتی دانیان لەسەر ئەوەی کەوا لەسەر شانیانە و هەڵسانە بە ئاگادارکردنەوەیان لە کاتی بێ ئاگاییان وە پڕ کردنەوەی هەڵەکانیەتی و دورکەوتنەوەیە لەو وشانەی کەوا دڵەکان بەهۆیەوە لە ئەمیر هەڵدێن. کۆتایی هات.

چوارەم: ئارامگری و پێچەسپاوی

الله تعالى دەفەرمووێت: ﴿ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە ئارام بگرن و ئارام گرین و سەنگەر بگرن و لە الله بترسن بەڵکو سەرفراز بن﴾ [آل عمران: 200]. وە لەبەر ئەوەی کەوا ڕێگا درێژە بۆیە پێویستی بە زادە، لەبەر ئەوەی کەوا هەوڵ و کۆششی پێویستە، وە پڕە لە ناخۆشی پێویستی بە ئارامگری و پێچەسپاوی هەیە، وە لەبەر ئەوەی کەوا جیهاد عیبادەتە الله واجبی کردوە لەسەرمان، پێویستە کەوا هەڵسین پێی هەرچەندە تاقیکردنەوەکان توند تر بن و کافران کۆببنەوە لەسەرمان، جا هەچەندە باتڵ بڵاو بێتەوە و سەرخەر کەمبێت بەڵام هەر پێویستە لەسەر ئەو ڕێگایە بڕۆین.

پێشەوا مالیك لە زەیدی کوڕی أسلم دەگێڕێتەوە و دەڵێت: ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕڕاح بۆ عومەری کوڕی خەتاب نوسی و باسی زۆری ژمارەی ڕۆم و ئەوشتانەی کرد کەوا لێی دەترسا، عومەر بۆی نوسی: لە پاشان هەرچەند تافیکردنەوەی توند دابەزێت بەسەر باوەڕدار ئیلا الله دوای ئەوە خۆشی بۆ دێنێت، وە ناخۆشی بەسەر دوو خۆشی زاڵ نابێت هەردەبێت دوای ناخۆشی الله تعالى دەفەرمووێت: ﴿ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە ئارام بگرن و ئارام گرین و سەنگەر بگرن و لە الله بترسن بەڵکو سەرفراز بن﴾ کۆتایی هات.

وە الله تعالى دەفەرمووێت: ﴿تاقیتان دەکەمەوە بە ترس و برسیەتی و کەم بوونەوەی ماڵ و مردن و برینداربوونی و کەم بوونەوەی بەرووبوم وە مزگێنی هەر بۆ ئارامگرەکانە﴾ [البقرة: 155]. أبو جعفر الطبري دەڵێت: ئەوە هەواڵە لەلایەن الله تعالیٰ بۆ شوێنکەوتەی ڕەسولەکەی باس کردوە صلى الله عليه وسلم کەوا تاقیان دەکاتەوە و بەلایان بۆ دەنێرێت لەسەریان توند دەکات تا بزانرێ کێ بەرەو دواوە دەگەڕێتەوە و پاشگەز دەبێتەوە. کۆتایی هات.

بەڵام پاشە ڕۆژی چاکە و ئارامگری بریتیە لەوەی، الله تعالیٰ دەفەرمووێت: ﴿ئەگەر ئارامتان گرت ئەوە باشترە بۆ ئارام گران﴾ [النحل: 126]، پشت بە الله ببەستن و ئەوە بڵێن کەوا پێشینی خۆتان وتوویەتی لە موجاهیدان: ﴿کاتێك ڕوبەڕوی جالوت و سەربازەکانی بونەوە وتیان یا الله ئارامیمان بۆ دابەزێنە و پێکانمان چەسپاو بکە و سەرمان خە بەسەر گەلانی کافر﴾ [البقرة: 250]، وە وتەی موەحیدە تاقیکراوەکان: ﴿پەرستراومان ئارامیمان پێببەخشە و بە موسڵمانی بمان مرێنە﴾ [الأعراف: 126]، بەهۆیەوە بوون بە شەهیدی چاك دوای ئەوەی کەوا جادووکەر و کافر بوون.

بزانە هەروەکو ڕاستگۆی دەستپاك چاکترینی لەوانە وتوە کەوا لە پەرستراوی پێی گەیشتوە: ((ئەم نەتەوە ئەگەر کۆببنەوە بۆ ئەوەی سودێکتان پێبگەیەنن ناتوانن هیچ سودێکتان پێ بگەیەنن جگە لەوەی کەوا الله بۆی نوسیوی، وەئەگەر کۆ بوونەوە بۆ ئەوەی کەوا زیانێکت لێ بدەن ئەوە ناتوانن زیانت لێبدەن ئیلا بە شتێك نەبێت کەوا الله لەسەرتی نوسیوە)) [أحمد والترمذي گێڕاویانەتەوە لە ابن عباس]. وە فەرموویەتی: ((بزانە کەوا سەرکەوتن لەگەڵ ئارامگرتندایە وە خۆشی لەگەڵ ناخۆشی دایە وە قورسی لەگەڵ ئاسانیە)) [أحمد گێڕاویەتەوە لە ابن عباس].

ئەوەی دەمەوێت کەوا تەئکیدی لەسەر بکەمەوە ئەوەیە کەوا جێگیر بوە لامان بە تاقیکردنەوە و بەسەرهات ئەوەی کەوا کاریگەری زۆرە بریتیە لە پێچەسپاوی ئەمیر بە تایبەتی لە کاتی جەنگ و لەکاتی ڕوبەڕوبونەوەی دوژمن، لە فەرمودەیەك دا هاتوە؛ پیاوێك پرسیاری کردلە بەراء الله لێی ڕازی بێت, ووتی: ئەی أبا عمارة پشتتان هەڵکرد لە

ڕۆژی حونەیین؟ بەڕاء وتی من گوێ ئەگرم: بەڵام ڕەسول اللە صلّى الله عليه وسلّم پشتی هەڵنەکرد، أبو سفیان کوڕی الحارث جڵەوی هێسترەکەی پێغەمبەری گرت کاتێك شەو داهات دابەزی و فەرمووی: ((من پێغەمبەرم و درۆ نیە... من کوڕی عبد المطّلب م)) [بوخاری و موسلیم گێڕاویانەتەوە]، ئەم فەرموودەیە سودی زۆر گەورەی هەیە بریتیە لە ڕوناکی ڕێگا.

یەکەم:

سەرکردایەتی لە ناو جەنگەکە بوو وە دور نەبوو لە زەوی شەڕەکە لە شارێك بۆ شارێکی تر نەچوو بە بیانوی ئەوەی کەوا ئەو هێمایەکە و بە ڕۆیشتنی بانگەواز کردن دەوەستێت کەمترین شت ئەوەیە کەوا بڵێین بە براکانمان کەوا ئەمیری ویلایەت بمێنێتەوە لە ویلایەت، و ئەمیری کەرت لە کەرتەکەی، و ئەمیری کەتیبە یان سریە لە نێوان سەربازەکانی، هەریەکێك ئەوانەی پێنەکرێت ئەوە ئەهل نیە بۆ ئەم کارە هەرچەندە ئەهلیش بێت بۆ ئەم کارە، شێر لەدەرەوەی دارستان ڕاو ناکات مەگەر بچێت و لە نێچیرێکی کەسێکی تر کەمێك بخوات.

دووەم:

ووتەی ((دەستی گرتبوو بە جڵەوی ئەسپەکەی))؛ -پێویستە لەسەر ئەمیر کەوا پێچەسپاوی نیشان بدات- وە ئەوەش بەکردار نیشان بدات، ئەوە ڕەسول اللە یە صلّى الله عليه وسلّم لەو شوێنە ترسناکە سواری هێسترێکی هێواش بو بوو.

ابن کثیر ڕەحمەتی اللە ی لێبێت دەڵێت: ئەوەش لە لوتکەی ئازایەتیە لەڕۆژێکی ئاوادا لە گۆڕەپانی جەنگ و دەنگی شمشێر کە سوپاکەی هەڵاتن بەڵام ئەو هەر لەسەر هێسترەکەی بوو لەگەڵ ئەوەی کەوا هێسترەکەی هێواش بوو لە ڕۆیشتن وە شیاو نەبوو بۆ کەر و فەر (لێدان لە دوژمن و پاشەکشێکردن) و ڕاکردن بەڵام ئەو لەگەڵ ئەوەشدا بەڕاکردن دەڕۆیشت بەرەو دوژمن وەناوی خۆی هێنا بۆ ئەوەی کەوا ئەوەی نەی دەناسی بیناسێت تا ڕۆژی دوایی [التفسير].

ابن بطال گێڕاویەتیەوە لە المهلّب و دەڵێت: ئەو فەرموودەیە ئەوەشی لێوەردەگیرێت کەوا سواربوونی هێستر لە جەنگ بۆ پێشەوا بۆ ئەوەیە کەوا زیاتر پێچەسپاو بێت و گومان نەبرێت کەوا ئەو خۆی ئامادە کردوە بۆ ڕاکردن و پشت هەڵکردن وە لە بابی سیاسی بۆ سەربازەکانی لەبەر ئەوەی ئەگەر ئەو پێچەسپاو بێت ئەوە سەربازەکانیش پێچەسپاو دەبن [شرح صحيح البخاري]. کۆتایی هات.

لەو وتەدا سود هەیە:

پێویستە کەوا ئەمیر سواری سەیارەیەك نەبێت کەوا خێراتر و بەهێزتر بێت لە سەیارەی سەربازەکانی واتە ئەوەی سەربازەکانی سواری دەبن یا وەکو سەیارەیەکی مام ناوەندی ئەوان وابێت ئەگەر کەمتر بێت باشتر بۆ ئەوەی دڵی سەربازەکان جێگیر بێت و دوور بێت لە گومانەکان وە بەتایبەتی ئەگەر سەیارەکە لە پارەو سامانی جیهاد بێت.

سێیەم:

ناساندنی صلّى الله عليه وسلّم خۆی بەوتەی: ((من پێغەمبەرم درۆ نیە... من کوڕی عبد المطّلب م)). کاتێك شەڕەکە بوو بەڕاستی برا بەلای براکەی دەڕوات و نایناسێت، لەبەر گەرمی ئەو حاڵەتەی کەوا تێیدایە یان لەبەر خێرای دۆڕان و ڕاکردن، لەبەر ئەوەوە پێویست بوو کەوا صلّى الله عليه وسلّم بەسەربازەکانی ڕابگەیەنێت وە بەوانەش ڕابگەیەنێت کەوا خۆشەویستی پێغەمبەریان لە دڵ دایە کەوا ئەو ئامادەیە و هەڵ نەهاتوە، وە ئەوەی پڕ بەدەنگی وت هەرچی ئەمنیات و ئاگاداری و یەدەگی سەربازی هەیە شوێنی نابیتەوە لەو کاتەدا ئەو وەستانە پێویستی بە قوربانی دان و پێچەسپاوی هەیە لەناخۆشی.

سەیرترینی سەیرەکان ئەوەیە کەوا هەندێك لە ئەمیرەکانی جهاد کاتێك شەڕەکە دەبێت بە ڕاستی و دوژمن هێرش دەکات بۆ ناوچەکە و شەڕ دەیەوێت گەرم بێت دەڕوات و ون دەبێت، وە پەیوەندی بەکەسەوە ناکات لەسەربازەکانی ناوی خۆی دەگۆڕێت و ڕەنگە وێنەی خۆشی بگۆڕێت بە بەهانەی پاراستنی سەرکردەی پێگەیشتوو، لەگەڵ ئەوەی کەوا ئەوە خۆی و براکانی دۆڕاندوە.

ئەگەر بێت و لەگەڵ سەربازەکان پێچەسپاوبا و بەرامبەری دووژمن ڕاوەستابا و دەرکەوتبا و بەئاشکرا پێچەسپاو بوایە، ئەوە ڕزگاری بۆ خۆی و براکانی دەهات لە شوێنی ئەوەی کەوا خۆی و ئەوانە ون بکات کەوا ئەمریان پێکراوە.

چوارەم:

پێغەمبەر صلّى الله عليه وسلّم هەروەکو لە صەحیحی موسلیم هاتوە دەفەرمووێت: ((ئەی عەباس بانگی بەیعەتدەرانی ژێ دارەکە بکە، عەباس وتی: -لەکاتێکدا کەوا عەباس دەنگی زۆر گەورە بوو- وتی: بەهەموو دەنگم هاوارم کرد: کوا بەیعەتدەرانی ژێر دارەکە ووتی سوێند بە اللە وەکو ئەوەی کەوا توشی سۆزداری بووبن لەکاتی بیستنی ئەو دەنگە، وەکو ئەو سۆزەی مانگا هەیەتی بۆ منداڵەکانی وتیان: یا لبيك یا لبيك)).

وە لە ابن ئیسحاقەوە: پیاو دەیویست کەوا وشترەکەی بگەڕێنێتەوە بۆ ناو شەڕەکە نەی دەتوانی، زرێیەکەی فڕێدەدا و شمشێرەکەی دەردەهێنا و پاشان دوای دەنگەکە دەکەوت [سيرة ابن هشام].

الطبري گێڕاویەتەوە کەوا صلّى الله عليه وسلّم بە عەباسی فەرموو: ((بانگکە ئەی سەرخەرەکان، وە ئەی کۆچەرەکان)) ئەویش بانگی دەکردن کۆمەڵ کۆمەڵ، پاشان وتی: ((ئەی هاوەڵانی سورەتی بەقەرە))، ووتی خەڵك هاتن بەیەك هاوار [التفسير].

وە لە صەحیحی موسلیم داهاتوە کەوا بانگەکە کورت کراوە لەسەر بەنی حارثی کوڕی خەزرەج، وە لێرە وەستانێکی گرنگ هەیە ئەویش کاری ڕەسول اللە صلّى الله عليه وسلّم بوو لەکاتی هەڵاتنی خەڵکی وە ڕیزەکان لەیەکتری جیابوونەوە، تاوای لێهات تەنها 12 کەسی لەگەڵ ماوە، وە لەزۆربەی گێڕانەوەکان دا دەڵێت هەشتا پیاو مانەوە، سوارچاکان و پاڵەوانانی جەنگ و بەجەرگەکان هەموویان ڕایان کرد وە لەوانە لە باشترین پیاوەکانی جەنگ سلمة کوڕی اکوع بوو، بەڵکو باشترین بەندەکانی اللە و هاوەڵانی بەیعەتی ڕیزوان و جگە لەوانەش ڕایان کرد.

ئا لەوکاتەدا سەرکردایەتی بێهیوا نەبوو، وە شمشێری فڕێ نەدا و هەڵبێت لەشەڕ، پاکی بۆ صلّى الله عليه وسلّم، بەڵکو جێگیر و پێچەسپاو بوو صلّى الله عليه وسلّم پاشان بانگی خەڵکانی کرد بە سیفاتەکانیان دەستی پێ کرد بە: یا ئەهلی باوەڕی دروست وە ئەی سەربازە دڵپاکەکان وە



گەشت کردن بۆ خیلافەت

ئەی بەندە ڕەبانیەکان هاوەڵانی دار (الشجرة) و بەیعەتی ڕیزوان، پاشان بانگی کرد ئەی ئەهلی قورئان وە ئەی هەڵگرانی پەرتوکی الله و بەتایبەتی هاوەڵانی سورەتی بەقەرە، کاتێك سورانەوە لەدەور و لە دڵی هەندێك لە باوەڕداران کەمێك خۆشەویستی خێڵەکایەتی دروست بوو بۆیە بانگی سەرخەرانی کرد کۆمەڵ کۆمەڵ، وە بەناوەکانیان، ئەوەی کەوا مەبەستی هەڵاتن بایە لە شەرمان دەترسا، کەچی لەناو ئەوانە دا هاوەڵانی دارەکە و سورەتی بەقەرەی تێدا بوو، صلی الله علیه وسلم دەستی پێکرد بەتایبەتەکان پاشان بانگی کرد بەگشتی.

وەستانێکی گرنگ ئەوەیە کەوا لەگەڵ ئەوەی هەڵاتن لە جەنگ گوناهێکی گەورەیە و لەناوچونە کەوا ترسی ئەوەی لێدەکرێت کەوا نەتوانێت تەوبە بکات و بکوژرێت قسەی ناشرینی بە هەڵاتوان نەوت و جوێنی پێنەدان بەڵکو بە پێچەوانەوە، بەڵکو بانگی کردن بە خێڵەکانیان (عشائر) دوای ئەوەی کەوا پێشینیان هەبوو لە تەوحید و جیهاد وە لەوەدا سود هەیە، ئەویش ئەوەیە لەکاتی توندی و ناخۆشی یەکەمین کەس کەوا پەنای بۆ دەبەی دوای الله عز وجل هاوەڵانی خاوەن پێشینە لە موجاهیدان، وە بانگیان بکەی بەناوی خێڵەکیە پاکەکان، هاوار هاوار نەکەی عەیبیان لێبگری، بەڵکو پێویستە پەیوەندی بکەی بەهەموو ئەوانەی کەوا وازیان هێناوە لە جیهاد و باسی پێشینەکەی بکەی لە جیهاد لە ڕێی الله و بیگەڕێنیەوە بۆ ڕیزی براکانی، لەبەر ئەوەی واز هێنانی واتە جێهێشتنی براکەت بۆ شەیتان و حیزبەکانی وە زیانە بۆ جیهاد و سەربازەکانی وە پیاوی ژیر ئەوە نالێت.

پێنجەم:
لەگەڵ ڕاستی ئەوەی کەوا هەڵات لە جەنگی حونەین، لە صەحیحی موسلیم دا هاتووە کەوا أمّ سُلیم خەنجەرێکی هەڵگرتبو دەبوت یا ڕەسول الله ئەوانە بکوژم کەوا هەڵاتن؟ پشتیان لە تۆکرد! ووتی رسول الله صلّے الله علیه وسلّم: ((ئەی أمّ سُلیم الله بۆمان بەسە و چاکترە)). وە لە بوخاری دەڵێت دەهەزار خەڵك لەگەڵ پێغەمبەر بوون و هەڵاتن، نەوەوی لەسەر ئەوانەی کەوا پێغەمبەر لەدوای فەتحی مەکە پێی وتن ئێوە ئازادن قسەدەکات و دەڵێت أمّ سُلیم پێی وابوو کەوا ئەوان مونافیقن و پێویستە بیانکوژێت لەبەر ئەوەی کەوا هەڵاتن. کۆتایی هات.

ئەوەی پێویستە باس بکرێت ئەوەیە کەوا ئەوانەی لەسەرەتاوە هەڵاتن لە ئازادکرداوەکانی فەتحی مەککە بوون کەوا پشێویان خستە نێو ڕیزەکانی موسڵمانان و ترسیان خستە دڵی پیاوە ئازا و موخلیصەکان، و ئەوەیان کرد.

بەڵام پرسیارەکە لێرەدا ئەوەیە؛ ئایا ڕەسول الله صلّے الله علیه وسلّم دور بێت لەو هەڵەبوو لەوەی کەوا ئەوانەی کردە هاوڕێی خۆی بۆ جەنگی حونەین کەوا ئەوان تازە موسڵمان بوبون؟ ئەویش لەبەر ئەوەی لەوکاتەدا موسڵمانان لاوازیان تێدابوو، وەکو باسکرا، وە ڕەسول الله صلّے الله علیه وسلّم بەژداری هیچ خولێکی تایبەتی پێنەکردن بە تەوحید؟ ئەوەی ئەوە دوبات دەکاتەوە کەوا ئەوان سەرەتابوون لە تەوحید ئەوەیە کە بە صەحیحی لە پێغەمبەرەوە هاتوە صلّے الله علیه وسلّم کاتێك دەرچوو بۆ حونەین بەلای دارێکی موشریکەکان دارۆیشت پێی دەوترا ذات أنواط کەوا چەکەکانیان پێوە هەڵدەواسی، وتیان ئەی ڕەسول الله: دارێکی أنواطیش بۆ ئێمە دابنێ هەرچۆن ئەوانە داری أنواطیان هەیە صلّے الله علیه وسلّم فەرمووی: ((سبحان الله! ئەوەتان وت کە گەلی موسا وتیان {پەرستراوێکمان بۆ دابنێ هەروەکو چۆن بۆ ئەوان پەرستراو هەیە} [الأعراف: 138]، [الترمذي گێڕاویتەوە لە أبي واقد الليثي]. کۆتایی هات.

ئەوە دەڵێم لەبەر ئەوەی هەندێك لە دڵ نەخۆشان عەیبیان لێگرتین بەوەی کەوا ژمارەیەکی زۆر هاتە نێو سوپاکانمان دوای ڕاگەیاندنی دەوڵەتی ئیسلامی، کە هەندێکیان هۆکاربوون بۆ شکانی برایان لە هەندێك شوێن، هیچ شتێکمان بەسەر نەهاتووە لەوەی ڕەسول الله صلّے الله علیه وسلّم گەورەتر بێت، بەڵکو ڕەسول الله صلّے الله علیه وسلّم کاتێك فەتح هات لە جەنگی حونەین بەهۆی الله وە کە هەرئەویان بەس بوو غەنائیمەکانی دابەش کرد بەسەر ئەوانەی کەوا ئازادی کردبوون لە فەتحی مەککە و موهاجیرەکان وە هیچی نەدا بە سەرخەرەکان هەروەکو لە صەحیحی بوخاری و جگە لەئەو هاتوە کە ئەوان زۆربەی سوپاکەیان پێك هێنابوو ابن القيّم ڕەحمەتی الله ی لێبێت دەڵێت: لە داناییەکان لەو جەنگە ئەوەیە کەوا الله پێغەمبەرەکەی سەرخست بە نەوەك زۆری سوپاکەی کەوا هاتن بۆ ناو ئاینەکەی وە نە بەزۆری بەشداربووانی جەنگەکەیە. [ابن حجر: فتح الباري] کۆتایی هات.

لەگەڵ ئەوەشدا مزگێنی دەدەین بەم نەتەوەیە کەوا سوپاس بۆ الله تاوەکو ئێستا هیچ ئەمیرێك چەکی فڕێنەداوە کەوا دوای ڕاگەیاندنی دەوڵەتی ئیسلامی هاتن بۆ ناو دەولە، بەڵکو ئەوان تاوەکو ئێستا پاڵەوانی جەنگەکان و سوارچاکی جەنگەکانن نمونەیان وەکو نمونەی پێشە خۆیانە کە هاتن بۆ ناو دەولە بۆ ئەو خێرە والحمد لله رب العالمين.




کاتێ بڕواداراانی مەدینە لە جەنگی ئەحزاب (خەندەق) تاقیکرانەوە بە ترسنۆك و دڵنەخۆشەکان و کاتێك چاوەکان ئەبڵەق بوبون و دڵەکانیش گەیشتبونە گەروو کاتێك بوو کە گومانی جۆراوجۆریان دەبرد بە الله، ئیمامی طەبەری لە (ابنِ ابی حاتم) لە (الحسن البصری)یەوە لەمانای ئەم ئایەتەدا {وَتظَنوُّنَ باِللَّه الظُّنوُناَ} [الأحزاب: 10]. دەفەرموێت: مونافیقەکان وا گومانیان دەبرد کە موحەممەد و هاوەڵەکانی بنبڕدەکرێن، بڕوادارانیش ئەوەندەی تر دڵنیابون و دەیانزانی ئەو بەڵێنەی الله پێیداون حەقە و الله دینەکەی خۆی سەردەخات بەسەر هەموو دینەکانی تر هەرچەندە هاوبەشدانەران پێیان ناخۆش بێت، پاشان مونافیقەکان وتیان {الْمُناَفِقُونَ وَالَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ مَّا وَعَدَناَ اللَّهُ وَرَسُولُهُ إِلّاغُرُورًا}[الأحزاب: 12].

ئیمامی طەبەری لە (ابن أبی حاتم) ئەویش لە (قتادة) ڕەحمەتی الله ی لێ بێت لە مانای ئەو ئایەتەدا فەرمویەتی: ئەمە وتەی هەندێك لە مونافیقەکان بوو دەیانوت موحەممەد باسی گرتنی فارس و ڕۆم مان بۆ دەکات لەکاتێکدا ئێمە لێرەدا گەمارۆدراوین تەنانەت کەسێك لە ئێمە ناتوانێ قەزای حاجەتی ئەنجام بدات، ئەو بەڵێنەی الله و پێغەمبەرەکەی پێی دابوین بەسەرکەوتن هەر فریودان و لە خشتە بردن بوو، ئا لەو کاتە پڕناخۆشیەدا زانیان ئیمانداران کە سەرکەوتنی الله زۆر نزیکە، وەك طەبەری لە عەبدوڵای کوڕی عەباسەوە لە

مانای ئەم ئایەتەدا {وَلَمَّا رَأىَ الْمُؤْمِنوُنَ الْحَزَابَ قَالُوا هَٰذَا مَا وَعَدَناَ اللَّهُ وَرَسُولُهُ وَصَدَقَ اللَّهُ وَرَسُولُهُ وَمَا زَادَهُمْ إِلّا إِيمَاناً وَتسَلِيمًا} دەفەرموێت: لەبەرئەوەی موسڵمانان دەیانزانی الله فەرمویەتی پێیان {أَمَ حَسِبْتمُ أنَ تدَخُلُوا الْجَنةَّ وَلَمَّا يَأْتكُم مَّثَلُ الَّذِينَ خَلَوْا مِن قَبْلِكُم مَّسَّتهُْمُ الْبَأسْاءُ وَالضَّراءُ وَزُلْزِلُوا حَتيَّٰ يَقُولَ الرَّسُولُ وَالَّذِينَ آمَنُوا مَعَهُ مَتىَٰ نصَر اللَّهِ أَلَا إنِّ نصَر اللَّهِ قَرِيبٌ}[البقرة : 214].

بۆیە کاتێ توشی ئەو بەڵا و ناخۆشی و ڕوبەڕوبونەوەیە هاتن بەرامبەر هەموو هێزەکانی کوفر لە جەنگی ئەحزاب بڕواداران مانای ئەو ئایەتە هاتە بیریان بۆیە ئیمانیان زیاتری کرد هێندەی تر ملکەچیان نواند، بڕواداران لەخەندەقەکانیان بەردەوام یادی ئەو ئایەت و فەرمودانەی پێغەمبەریان دەکرد(صلی الله علیە وسلم)کە هەواڵی پێدابون بەوەی توشی دێن لەو ڕێگەیەدا بۆیە هیچ کات ئەو هەواڵ و نیشانانەی پێیان درابوو کە دەبوو توشی ببن ساردی نەکردنەوە بەڵکو زیاتری صەبر و ئارامی پێ دەبەخشین زیاتر ملکەچ دەبون بۆ قەدەری الله تعالی چونکە بەنیشانەی هاتنە دی بەڵینەکانی الله و پێغەمبەرەکەیان(صلی الله علیە وسلم) دەزانی، بەڵام لەبەرامبەردا مونافیق و دڵ نەخۆشەکان لەدڵەڕاوکێ دا بوون گاڵتە و تانەیان دەدا بەو بەڵێنانەی الله پێغەمبەرەکەی (صلی الله علیە وسلم) وە کافر و طاغوتانیش بەقوەت و هێزی خۆیان ئەیاننازی و شانازیان پێوە

دەکرد و گومانی خراپیان بە اللە دەبرد، وایان دەزانی اللە ی عەزیز و حەکیم پشت دەکات لە دین و خۆشەویستەکانی و دوژمنانی سەردەخات تا بەردەوام هەموو ئاین و گوێڕایەڵی بۆ غەیری اللە بێت، پاك و بێگەردی اللە لە گومانی نەفامان بەڵکو اللە تعالی جڵەو بۆ دوژمنانی شل دەکات و لەپڕێکدا دەیانگرێت کە هەستیان پێ نەکردبێت، بۆیە دەبینی دوژمنان هەمیشە بەرەو بەدیهاتنی مەکری اللە و ئەو سەرەنجامە بەدبەختیەی خۆیان هەنگاودەنێن {یُخْرِبُونَ بُیُوتَهُم بِأَیْدِیهِمْ وَأَیْدِی الْمُؤْمِنِینَ فَاعْتَبِرُوا یَا أُولِی الْأَبْصَارِ} [الحشر: 2].

نمونەی ئەمەش کۆبونەوەی خاچپەرستان و پشتیوانانیانە لە صەحەوات وتورکەکان کە لە ریفی باکوری حەلەب خۆیان کۆکردۆتەوە بە ئاشکرا ئەڵێن دابق ئامانجی سەرەکیمانە وادەزانن بەوەی بە پێیە پیسەکانیان و ئالا بۆگەنەکانیان بچنە ناویەوە دەبێتە سەرکەوتنێکی مەعنەوی مەزن بەسەر دەوڵەتی ئیسلامی، وا گومان دەبەن سەربازانی خیلافەت جیاوازی ناکەن لە جەنگی دابقی بچوك و داستانی گەورەی دابق بۆیە ئەگەر سەربازانی دەوڵەتی ئیسلامی -اللە تعالی جێگیریان بکات- بکشێنەوە ئیتر وا دەزانن ئیتر هەڵگری ئالای (العقاب) نابن و نابنە سەرمەشقی سەرکەوتنەکان بۆ داستانی داهاتووی دابق و سەربازەکانی پۆل بە پۆل وازی لێ دێنن .

لە أبي هريرة -اللە لێی ڕازی بێت- کەوا ڕەسول اللە -صلی اللە علیە وسلم- فەرمویەتی: قیامەت هەڵناسێت تاکو ڕۆمەکان لە (أعماق) یان (دابق) دادەبەزن، ئینجا لەشکرێکیان لە مەدینەوە بۆ دەردەچێت کە لەچاکترینی دانیشتوانی سەر زەوین لەو ڕۆژگارەدا، کاتێ ڕیز دەبن ڕۆمەکان دەڵێن: وازمان لێبێنن بابجەنگین لەگەڵ ئەوانەی کە لەئێمە بون و بەدیل گیران (موسڵمان بون ئیستا هاتون دەجەنگن لەدژمان) موسڵمانەکان دەڵێن نە بە اللە وازتان لێ ناهێنین بجەنگن لەگەڵ براکانمان، ئینجا دەجەنگن لەگەڵیان سێ یەکیان لەجەنگەکە هەڵدێن و اللە تەوبەیان لێ قبوڵ ناکات، سێ یەکیشیان دەکوژرێن کە چاکترینی شەهیدانن لای اللە سێ یەکەکەی تریشیان سەردەکەون، هەرگیز توشی فیتنە نابن ئینجا (قوستەنتینیە) ئازاد دەکەن، لەکاتێکدا خەریکی دابەش کردنی دەستکەوتی جەنگەکەن، شمشێرەکانیان بەدار زەیتونەوە هەڵواسیوە، شەیتان بەدرۆ لەناویاندا هاوار دەکات: دەجاڵ دوای ئێوە چۆتە ناو ماڵ و منداڵتان ئەوانیش دەردەچن کاتێ ئەوان سەرگەرمی خۆسازدان دەبن بۆ جەنگ ڕیزەکانیان ڕێك دەخەن و قامەت دەکرێ بۆ نوێژ "عیسای کوڕی مەریەم" دادەبەزێت پێش نوێژیان بۆ دەکات کاتێ دوژمنی اللە (دەجال) دەیبینێ دەتوێتەوە وەك چۆن خوێ لە ئاودا دەتوێتەوە، خۆ ئەگەر وازی لێ بهێنایە خۆی لەخۆیدا دەتوایەوە تا لەناو دەچوو، بەڵام اللە بەدەستی ئەو دەیکوژێت، خوێنەکەی بەڕمەکەیەوە نیشانیان دەدات. [موسلیم گێڕاویەتیەوە].

وە یوسەیری کوڕی جابر (اللە لێی ڕازی بێ) فەرمویەتی عەبدوڵای کوڕی مەسعود فەرمویەتی: قیامەت هەڵناسێت تاکو وای لێ دێت نە میرات دابەش دەکرێ و نەدڵ بەدەستکەوتی جەنگ خۆش دەکرێ، پاشان بەدەستی ئاماژەی کردە ڕووە و شام وتی: دوژمنانێك خۆیان کۆدەکەنەوە بۆ ئیسلام خوازان و ئیسلام خوازانیش خۆیان کۆدەکەنەوە بۆ ئەوان وتم: مەبەستت لە ڕۆمەکانە وتی: بەڵێ، ئیتر لەو کاتەدا جەنگ بەرپادەبێت و بگرە و بەردەیەکی سەخت ڕوودەدات کە موسڵمانان پەیمانی مردنی مەرگی تێدا دەدەن، کەتا سەرنەکەون نەگەڕێنەوە، ئینجا کوشتار دەست پێ دەکەن تاکو شەو دادێت و دەبێتە بەربەست لەنێوان ئەمان و ئەواندا، ئیتر هەردولا ئەمانیش و ئەوانیش دەگەڕێنەوە هیچیان نابەزن و مەرجەکەش نایاتە دی، پاشان موسڵمانان مەرجێکی تر دەدەن یان دەبێت بمرن یان بەسەرکەوتویی بگەڕێنەوە، دیسان دەکەونەوە کوشتارکردن تا شەویان بەسەردادێت و دەبێتە بەربەرست لەنێوانیان ئیتر هەردولا ئەمانیش و ئەوانیش دەگەڕێنەوە و هیچیان نابەزن مەرجەکەیش نایاتە دی، پاشان موسڵمانان مەرجێکی تر دەدەن یان دەبێت بمرن یان بەسەرکەوتویی بگەڕێنەوە، دیسان دەکەونەوە کوشتارکردن تا شەویان بەسەردادێت و دەبێتە بەربەرست لەنێوانیان ئیتر هەردولا ئەمانیش و ئەوانیش دەگەڕێنەوە و هیچیان نابەزن مەرجەکەیش نایاتە دی، پاشان بۆ ڕۆژی چوارەم چی ماوە لە پاشماوەی ئیسلام خوازان بەرەو ڕویان دەردەپەڕن، تاوەکو اللە تێکیان دەشکێنێ، جەنگێکی خوێناوی بێ وێنەی کەس نەدیدە دەکەن، بەڕادەیەك باڵندە گوزەر دەکات بەملاولایاندا بەجێیان ناهێڵێت هەتا دەمرێ و دەکەوێتە خوارەوە وای لێ دێت بەرەبابێك کەسەد کەس بوبن سەرژمێری خۆیان دەکەن تاقلەبربوون و تەنها یەك پیاویان ماوە، ئیتر بەچ دەستکەوتێك دڵ خۆش بکرێت، یاخود چ میراتێك دابەش بکرێت، لەکاتێکدا ئەمان لەم حاڵەدا دەبن گوێیان لێ دەبێت کە بەڵایەکی لەوە گەورەتر دامێن گیریان بوە، کاتێ جارچی دێتە لایان و هاواری لێ دەکات دەجاڵ لەدوای خۆیان بەربۆتە ناو ماڵ و منداڵیانەوە ئەوانیش چی یان پێیە هەر هەمووی فڕێ دەدەن و ڕودەکەنە ماڵەوە دە سوارچاك لەپێش خۆیانەوە دەنێرن پێغەمبەری پێشەوا (صلى اللە علیە وسلم) دەفەرموێت: (من زۆرچاك ناوی خۆیان و باوکیان ڕەنگ و شێوەی ئەسپەکانیان دەزانم ئەوان لەو ڕۆژەدا چاکترین سواری سەرزەوین). موسلیم گێڕاویەتیەوە.

"لە عەوفی کوڕی مالیك" (اللە لێی ڕازی بێ) پێغەمبەر-صلی اللە علیە وسلم- فەرمویەتی: شەش شت بژمێرە پێش هاتنی قیامەت، مردنی من، پاشان فەتحی قوستەنتینیە، پاشان پەتاو کۆلێرا کە وەك نەخۆشی (قعاص) ی ئاژەڵ وایە بڵاوئەبێتەوە خەڵکی بەکۆمەڵ ئەکوژێت، زۆربونی پارە و سامان هەتا پیاوی وا هەیە سەد دیناری پێ ئەدرێت توڕە ئەبێت و داوای زیاتر ئەکات، پاشان فیتنەیەکی تر سەر هەڵدەدات کە ماڵی عەرەب نامێنێت توشی ئەو فیتنەیە نەبێتەوە، پاشان ئاگربەستێك لەنێوان ئێوە و بەنی ئەسفەر کە (ڕۆمەکان و ئەوروپیەکانی ئێستان)، دروست ئەبێت بەڵام لەدواییدا ئاگربەستەکە ئەشکێنن و لەژێر هەشتا ئالاوە دێنە سەرتان و لەژێر هەر ئالایەك دوازدە هەزار سەرباز جەنگتان لەگەڵ دەکەن. بوخاری گێڕاویەتیەوە.

ئەیگێڕێتەوە (أبو داود ) لە " ذي مخمر" (اللە لێی ڕازی بێ) کەوا پێغەمبەر-صلی اللە علیە وسلم- فەرمویەتی: ئاشتەواییەك لەگەڵ ڕۆمەکان مۆر دەکەن و پاشان ئێوە و ئەوان پێکەوە شەڕ لەگەڵ دوژمنانتان دەکەن، سەرکەوتن بە دەست دەهێنن و دەستکەوتتان دەبێت و بەسەلامەتی دەگەڕێنەوە، پاشان لەشوێنێکی بەرز کۆئەبنەوە هەتا گاورێك لە (سوپاکە) خاچێك بەرزدەکاتەوە، و دەڵێت خاچ سەرکەوت موسڵمانێك توڕە ئەبێت و دێت خاچەکە دەشکێنێت، لەوکاتەدا ڕۆمەکان بەڵێن وپەیمانەکەیان دەشکێنن و لەوێوە شەڕ و داستانە گەورەکە ڕوودەدات. [ أحمد و ابن ماجه و أبو داود و ابن حبان والحاکم گێڕاویانەتەوە وزەهەبیش بە دروستی داناوە].

وە لە لەفظي (ابن حبان) هاتوە: ئاشتەواییەك لەگەڵ ڕۆمەکان مۆر دەکەن و پاشان ئێوە و ئەوان پێکەوە شەڕ لەگەڵ دوژمنێك دەکەن لەدوایانەوە، سەرکەوتن بە دەست دەهێنن و

دەستکەوتتان دەبێت و بەسەلامەتی دەگەڕێنەوە، پاشان لەشوێنێکی بەرز کۆئەبنەوە هەتا گاورێک لە(سوپاکە)خاچێك بەرزدەکاتەوە، و دەڵێت خاچ سەرکەوت و یەکێك لە موسڵمانەکانیش دەڵێت: نەخێر بەڵکو الله سەرکەوت پاشان موسڵمانەکە بۆ خاچەکە دەچێت کە نزیکە لێوەی و دەیشکێنێ خاچپەرستەکانیش بۆی دەچن و لەملی دەدەن و ئەوجا موسڵمانانیش پەلاماری چەکەکانیان دەدەن و شەڕ و کوشتار دروست ئەبێت، الله تعالى رێز لەو کۆمەڵە موسڵمانە دەنێت بەشەهیدبون، ڕۆمەکانیش بەگەورەکەیان ئەڵێن ئەوە رزگارمان بوو لە عەرەب! ئا لەو سەروبەندەدا کۆدەبنەوە بۆ داستانەکە و لەژێر هەشتا ئاڵاوە بۆتان دێن هەر ئاڵایەکیش دوازدە هەزار جەنگاوەری لەژێردایە.

بۆیە ئەو ڕوداوانەی پێش ڕوداوی داستانی دابق دەکەون بریتی دەبێت لەو ئاشتەواییەی کە لەنێوان موجاهیدانی موەحید و گاورەکانی ڕۆم دەکرێ بۆ جەنگان و کوشتاری دوژمنێك لەدوای خۆیانەوە،

دوای ئەوەی موجاهیدان بەسەر ئەو دوژمنەیان سەردەکەون ئینجا ئەو دووکۆمەڵە کۆدەبنەوە لەدابق و لەبەرزاییەکانی دەوروبەری، و یەکێك لە گاورەکان خاچێك بەرزدەکاتەوە و ئەڵێ خاچ سەرکەوت لەوکاتەدا موەحیدێك توڕە دەبێت خاچەکە دەشکێنێت ئەوجا ڕۆمەکان خۆیان کۆدەکەنەوە بۆ داستان و شەڕە گەورەکەی دابق بەهەزاران جەنگاوەرەوە بۆ موسڵمانان دێن، پاشان موجاهیدان پشتی برا کۆیلەکانیان بەرنادەن ئەوانەی بەبەندە گیراون و موسڵمان بونە لە ڕۆمەکان، ئەمەیە ڕووداوەکانی داستانی گەورەی دابق کە بریتیە لە جهاد لە تێکۆشان لە کوشتن و لەکوشتار لە ئازار و لە ئومێد، موجاهیدی موەحید لەسەرڕێی بەصەبر و یەقینەوە بەردەوام بێ لە سەنگەرگرتن و جەنگ و کوشتاری تا ئەو کاتەی الله وشەی دوژمنەکانی دەشکێنێ و دڵەکانیان تێك و پێك ئەدات شەڕ و ئاژەوەی خۆیان ئەخات بەگژی خۆیان و ملی یەکتر ئەپەڕێنن {عَسَىٰ أَن يَكُونَ قَرِيبًا} وە ئەو ڕوداوە مەزنانەی ئەمڕۆ لە باکوری شام دەگوزەرێ لە دابق و دەوروبەری لە نیشانە و ئامادەکاریەکانە بۆ ڕودانی داستانە گەورەکەی دابق -ان شاء الله- کە بەرۆکی خاچپەرستان دەگرێ زوو یان درەنگ کە دەبێت بە مەرجی کۆمەڵی موسڵمانان ڕازی ببن و ئەو سەرکەوتنانەی بەدوای دا دێت پاشان خاچپەرستەکان پەیمان دەشکێنن و دەبێتە داستانە گەورەکەی دابق، ئەمڕۆش دوژمنانی الله لە ڕیزەکانیان دوبەرەکی و ناکۆکیە لەمێژینەکانی ڕۆژئاوای خاچپەرست و ڕۆژهەڵاتی خاچپەرست دوبارە نوێ دەبێتەوە و لەسەر هەڵدانەوەیە بەهەمان شێوە ناکۆکی لەنێوان پشتیوانە مورتەددەکانیان وەك تورکەکان ناکۆکیان هەیە لەگەڵ کوردەکان، وە صەحەواتەکانی تورکیا ناکۆکن لەگەڵ صەحەواتەکانی ئوردن و ڕافیزەی عیراق ناکۆکن لەگەڵ کوردەکانی عێراق و کوردەکانی ڕۆژئاوا ناکۆکن لەگەڵ کوردەکانی ڕۆژهەڵات و نوصەیریەکانی شام ناکۆکن لەگەڵ کوردەکانی شام {تَحْسَبُهُمْ جَمِيعًا وَقُلُوبُهُمْ شَتَّىٰ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَعْقِلُونَ} [الحشر: 14].

وە ئەم هاتن و چونەمان(الكر والفر) لەدابق و دەوروبەری کە جەنگی بچوکی دابقە، گومانی تێدا نیە بە جەنگ و داستانی گەورەی دابق کۆتایی دێ دوای ئەوەی بەواقیعی ئەو



خاچ پەرستان

بەڵێنەی الله و پێغەمبەرەکەی -صلى الله عليه وسلم- دێتەدی لە ئاشتەوایی کردن لەنێوان موسڵمانان و ڕۆمەکان پاشان غەدری ڕۆمەکان و دوای ئەوەش فەتح کردنی قوستەنتینیە پاشان ڕۆم.

"ئەبو هورەیرە" (الله لێ ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر -صلى الله عليه وسلم- فەرمووی: (ئەم شارەتان بیستوە کە لایەکی لەوشکانی و لایەکی لەدەریادایە) گوتیان: بەڵێ ئەی پێغەمبەر فەرمووی: (قیامەت هەڵناسێت تاکو حەفتا هەزارکەس لەنەوەی (ئیسحاق) لەشکرکێشی بۆنەکەن، کاتێ کە بۆی دێن و دادەبەزن نە بەچەك جەنگ دەکەن و نەتیر دەتەقێنن، بەڵکو دەڵێن: "لا إله إلا الله و الله أكبر" لایەکی دەگیرێت، "سەور" دەڵێت: من وادەزانم کە فەرمودەی ئەو لایەی لەدەریادایە -پاشان دوبارە دەڵێن: "لا إله إلا الله والله أكبر" ئەولاکەی تریشی دەگیرێت، پاشان هەمدیسان بۆجاری سێهەم دەڵێن: "لا إله إلا الله و الله أكبر"ڕێگەیان بۆچۆڵ دەکرێت و دەچنە ناویەوە دەکەونە کۆکردنەوەی دەستکەوت لەکاتێکدا کە خەریکی دابەشکردنی دەستکەوتەکان دەبن هاوڕێیەکیان پێ دەگات و دەڵێت: دەجاڵ دەرچوو ئیتر هەموو شتێك وازلێ دەهێنن و دەگەڕێنەوە. موسلیم گێڕاویەتەوە.

الله تعالى بیگێڕێ لەژێر دەستی موجاهیدانی خیلافەت هەروەك چۆن شێخ "أبو مصعب الزرقاوي" -الله لیی وەرگرتبێت- دەیفەرموو: لێرە ئێمە جهاد دەکەین و چاومان لەسەر قودسە لێرە جەنگ و کوشتار دەکەین ئامانجمان ڕۆمایە، گومان باشی بە الله بمانکات بە کلیلی کردنەوەی موژدەکانی پێغەمبەرایەتی و قەدەری ئیلاهی [رياح النصر].

الله تعالى بەسەر گشت کارەکانی خۆیدا زاڵ و بەدەسەڵاتە بەڵام زۆربەی خەڵکی ئەمە نازانن.

# تەوحیدی الله
# لە
# فەرمان ڕەوایەتی دا

باوەڕ بەوە: کە هیچ یاسا دانەرێکی شایستە نیە جگە لە الله، ناسراوە بە هەموو ئاکارێکی تەواو، حوکم بەتەنها بە شەرعی ئەو دەکرێت

{إِنِ الْحُكْمُ إِلَّا للهِ أَمَرَ أَلَّا تَعْبُدُوا إِلَّا إِيَّاهُ ذَٰلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ} [يوسف: 40]
{أَفَغَيْرَ اللهِ أَبْتَغِي حَكَمًا وَهُوَ الَّذِي أَنزَلَ إِلَيْكُمُ الْكِتَابَ مُفَصَّلًا} [الأنعام: 114]
{أَفَحُكْمَ الْجَاهِلِيَّةِ يَبْغُونَ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ اللهِ حُكْمًا لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ} [المائدة: 50]

## ئەم تەوحیدە سێ پایەی هەیە:

**تەوحیدی الله لە یاسادانان**

[هیچ یاسا دانەرێك نیە شایستە بێت جگە لە الله، ناسراوە بە هەموو ئاکارێکی تەواو] الله تعالی دەفەرموێت: **{شَرَعَ لَكُمْ مِنَ الدِّينِ مَا وَصَّىٰ بِهِ نُوحًا وَالَّذِي أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ وَمَا وَصَّيْنَا بِهِ إِبْرَاهِيمَ وَمُوسَىٰ وَعِيسَىٰ} [الشورى: 13]، {أَمْ لَهُمْ شُرَكَاءُ شَرَعُوا لَهُم مِّنَ الدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَن بِهِ الله} [الشورى: 21].**

**تەوحیدی الله لە حوکم کردن**

[حوکم تەنها بە شەرعی ئەو دەکرێت] **الله تعالی دەفەرموێت: {وَأَنِ احْكُمْ بَيْنَهُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللهُ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَاءَهُمْ} [المائدة: 49]، {وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَا أَنزَلَ اللهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ} [المائدة: 44].**

**تەوحیدی الله لە بردنەوەی کێشە کان بۆ لای**

[کێشەکان نابرێنە لای هیچ یاسایەك جگە لە یاسا و شەرعی الله] **الله تعالی دەفەرموێت: {وَمَا اخْتَلَفْتُمْ فِيهِ مِنْ شَيْءٍ فَحُكْمُهُ إِلَى اللهِ} [الشورى: 10]، {أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ آمَنُوا بِمَا أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُوا إِلَى الطَّاغُوتِ وَقَدْ أُمِرُوا أَن يَكْفُرُوا بِهِ} [النساء: 60].**

## ئەوانەی ئەبنە هەڵوەشاندنەوەی ئەم تەوحیدە وە خاوەنەکەی ئەبەنە پاڵ موشریکەکان:

**باوەڕ:** بەوەی کە جگە لە الله مافی یاسادانانی هەیە، وە یاسای الله کەم و کورتی تێئەکەوێت لەبەر ئەوەی ناگونجێت بۆ هەموو کات و شوێنێك، یان مرۆڤ بۆی هەیە حوکم بکات بەشتێك جگە لەوەی الله دای بەزاندوە، یان حوکمی جگە لە الله باشترە لە حوکمی الله یان هاوشێوەیەتی.

**دانانی یاسا:** بریتیە لە ململانێکردن لەگەڵ الله لە ربوبیەتدا، وەبکەرەکەی تاغوتە، وەکو ئەندامانی پەرلەمانی یاسا دانەر وە دەستور دانەران و یاخود دانانی یاساکانی خێڵەکایەتی، فەرمانەکە ئەوانەش دەگرێتەوە کە خۆیان ئەپاڵێون لە هەڵبژاردنەکانی یاسادانان وە دەنگدەرانیش کە دەنگیان پێدەدەن یان یاخود دەنگ بە هەڵبژێردراوەکان دەدەن، وە جیاوازی نیە لە نێوان (عەلمانی) یاخود (ئیسلامی) لەمەدا، چونکە یاسادانان مافی الله یە بەتەنها، شەریکی نیە تیایدا.

**حوکم کردن بەجگە لەوەی الله دایبەزاندوە:** ئەوەی حوکم بە یاسایەك جگە لەوەی الله دایبەزاندوە دەکات تاغوتە، وەکو فەرمان ڕەواکان و دادوەرەکان کە فەرمان دەکەن بە یاسا دەستکردەکان و یاسا خێڵەکیەکان و ئەحکامەکانی ژوری بازرگانی، ئەم فەرمانە ئەوانەش دەگرێتەوە کە خۆیان ئەپاڵێون لە هەڵبژاردنەکانی جێبەجێکرندا وە ئەوانەش کە دەنگیان پێدەدەن، جیاوازی نیە لەنێوان "عەلمانی" و"ئیسلامی"، چونکەی شیرك و کوفر ڕێگەی پێنەدراوە لە بەرژەوەندی بێت یان پێویستی.

**بردنەوەی کێشەکان بۆ لای جگە لە الله:** بریتی یە لە گەڕانەوە بۆ یاسای تاغوت لەکاتی ناکۆکی و جیاوازی دا، بکەرەکەی کافر و موشریکە، وەك یەك وان لەوەدا کەسێك باوەڕی بە ڕاستی ئەو یاسایانە هەبێت یاخود بە باطل و پوچی دابنێت، بەڵام دەچێتە لای بۆ بەدەستهێنانی سودێك یان لابردنی زیانێك، وەکو ئەوانەی کە کێێشەکانیان ئەبەن بۆ لای دادگاکانی تاغوتەکانی مەدەنی و سەربازی و بازرگانی و سەندیکاکان، وەیەك لاکردنەوەی خێڵەکیەکان و هاوشێوەکانی، وە دادگای نێودەوڵەتی سەربە نەتەوە یەکگرتوەکان و ئەوانی دیکە.

**وە هەرکەسێك بکەوێتە ناو شیرکی گەورە هیچ بیانویەکی بۆ نیە جگە لە زۆرلێکراو، پێویستی و بەرژەوەندی زۆلێکردن نیە، با هەرکەسێك ئاگاداربێت لەم شێوانە لە شیرك و کوفر و تەوبە بکات لە مورتەددی ئەگەر کەوتۆتە ناو یەکێك لەوانە.**



# واجب بوونی قسە کردن لەسەر زانای خراپ و ئابڕو بردنیان

ئەو شەریعەتەی ئیسلامە دابەزیوە بۆ چەسپاندی پێنج پێویستیەکە، کەوا ژیانی خەڵك ڕاست نابێت لەئاین و دونیایان مەگەر بەو پێنجە نەبێت، ئەوانیش: پاراستنی ئاین، و پاراستنی گیان، و پاراستی عەقڵ، و پاراستنی ئابڕو، و پاراستنی سامان، گومانی تێدا نیە کەوا پاراستنی ئاین گەورەترین بەرژەوەندی و مەبەستە، لەبەر ئەوەیە کەوا اللە شیرك و هۆکارەکانی قەدەغە کردوە، وە قەدەغەی کردوە کەوا بێ زانست قسەی لەسەر بکرێت، وە بیدعە و داهێنراوەکانی قەدەغە کردوە، لەبەر ئەوەیە کەوا لە واجبەکان: ئەوەیە کەوا ئەم نەتەوەیە ئاگادار بکرێتەوە لە شیرك و بیدعە، و ڕونکردنەوەی حاڵی ئەهلەکانیان و ئاشکراکردنی پوچیان ئەوەش لە ئامۆژگاریە واجبەکانە بۆ پاراستنی ئاینی موسڵمانان، هەروەکو جێگیر بوە لە تەمیمی داری -اللە لێی ڕازی بێت- کەوا پەیامبەر -صلی الە علیە وسلم- دەفەرموێت ئاین ئامۆژگاریە، وتمان بۆ کێ؟ فەرمووی (بۆ اللە و ڕەسولەکەی و پێشەواکانی موسڵمانان و موسڵمانان بەگشتی) [موسلیم گێڕاویەتیەوە]. لەبەر ئەوەیە کەوا وەڵامدانەوەی ئەهلی بیدعە و ئاگادارکردنەوە لێیان لە فەرمان کردنە بە چاکە و ڕێگری کردن لە خراپە، اللە تعالی دەفەرمووێت (نەتەوەیەك لەناو ئێوە دەبێت بانگەوازی چاکە دەکەن و فەرمان بە چاکە دەکەن و ڕێگری لە خراپە دەکەن [ال عمران: 104] ابو عەباس ئیبن و تەیمیە، ڕەحمەتی اللە ی لێبێت دەڵێت: ((وە نمونەی ئەهلی بیدعە و ئەهلی وتارە دژەکانی کیتاب و سوننە یان عیبادەتە دژەکانی کیتاب و سوننە، ڕون کردنەوەیماڵیان و ئاگادارکردنەوەی نەتەوە لێیان واجبە بە ڕێککەوتنی موسڵمانان.... کەوا بووە پاك بوونەوەی ڕێگەی اللە و ئاین و ڕێباز و شەرعەکەی و دورخستنەوەی زیادە ڕۆیی و ئەوانە و دوژمنایەتیان لەسەر ئەوە واجبێکی کیفائیە بە ڕێککەوتنی موسڵمانان ئەگەر اللە کەسێك دانەنێت بۆ دورخستنەوەی زیانی ئەوانە لە خراپ کردنی ئاین کەوا خراپیەکەی گەورەترە لە دەست گرتنی دوژمنی ئەهلی جەنگ بەسەر دەسەڵات; ئەوانە ئەگەر دەستیان گرت بە دەسەڵات دڵەکان و ئەوەی کە لەگەڵ دڵ دایە خراپی ناکەن مەگەر لەسەر شوێنکەوتوانیان بێت بەڵام ئەوانە دڵەکان خراپ دەکەن لەسەرەتاوە)) [مجموع الفتاوی].

قسە وتن و عەیب گرتن لەوانە بەناوەکانیان جێگیر بوە لە سوننە، وەپێوانە دەکرێت لەسەر خاوەنی بیدعە، غەیبەت کردنی ڕێگە پێدراوە بۆ ئاگادار کردنەوەی خەڵکی لێی، عائیشە -اللە لێی ڕازی بێت- دەفەرمووێت: ((پیاوێك داوای ئیزنی لە ڕەسول اللە کرد -صلی اللە علیە وسلام-، فەرمووی: ((ڕێگەی بدەن خراپترین برای خێڵەکیە) یان (کوڕی خێڵەکیە)، کاتێك هاتە ژورەوە قسەی هەبوو، وتم: ئەی ڕەسول اللە، ئەوەی کەوتت وتت، پاشان وتەکان نەرم بوو بۆی؟ فەرمووی ئەی عائیشە خراپترینی خەڵکی ئەوەیە کەواز لە خەڵك بهێنێت، لە ترسی خراپە)) [متفق علیە]. وە پێشین ئاگاداریان دەکردەوە لەوەی کەوا زانست لە بیدعەکار وەربگیرێت هەروەکو موسلیم لە صەحیحەکەی دا هێناویەتی لەپێشەوا


زاناکانی تاغوت

ئیبن سیرین فەرمووی: (ئەو زانستە ئاینە، سەیرکەن لە کێ ئاینەکەتان وەردەگرن)). وە فەرمووی: ((پرسیاری سەنەدیان نەدەکرد، بەڵام کە فیتنە دروست بوو، وتیان: باسی پیاوەکانتانمان بۆ بکەن! سەیری ئەهلی سوننە دەکرێت و فەرموودەیان وەردەگیرێت، وە سەیری ئەهلی بیدعە دەکرێت و فەرموودەکانیان وەرناگیرێت)).

ئەوە شەبابەی کوڕی سوار الفزازي: (کۆچی دوای کردوە: 208ک) کاتێك لێیگۆڕا بە بیدعەی ئیرجاء ئیمام ئەحمەد وازی لە وەرگرتن هێنا لێی وە وتی: (هیچم لێوەرنەگرتوە لەبەر ئیرجائەکەی) [تهذيب الكمال].

کورت کراوەی ئەوە ئەوەیە کەوا ئەهلی بیدعە هەیانە کەوا زانستێکی زۆری لەبەر کردوە وە زیرەك بووە لە هەندێك تەکنیك لەگەڵ ئەوەش پێشەواکانی ئەهلی سوننە پێیان سەرسام نەبوون، بەڵکو لێیان دورکەوتنەوە، لەبەر ئەوەی زانسیتان نەبوە بە پاك بوونەوەیان بەڵکو بوو بە بیانوو لەسەریان، زانست بریتیە لە ترسان لە الله، وە زانست بریتیە لە کردار، هەروەکو ئیبراهیمی نەخەعی دەڵیت: ((ئەگەر لە شێخێکمان وەرگرتبایە ئەوا پرسیاری خواردن و خواردنەوەی مان لێدەکرد(واتە لەکێی وەرگرتوە) وە چون و هاتنیمان لێدەکرد، ئەگەر رێك بوایە ئەوە لێمان وەردەگرت ئەگەر نا نەدەهاتین بۆی)) [کامل في ضعفاء الرجال].

بەڵکو پێشین (سەلەف) دوریان نەدەگرت لە باسی کەسێك کەوا هەڵەی بکردبایە لە گێڕانەوە -جا لە خراپی لەبەر کردنی بێت یان تەرتیبی بێت- ناویان دەهێنا هەرچەندە لە ئەهلی چاکە و ڕاستی بوایە، تاوەکو خەڵك ئاگادار بکەنەوە لە هەڵەکانی، نەوەك بڵێین کەوا لە غەیبەتە قەدەغە کراوەکانە بەڵکو ئەوە لە ئامۆژگاریە واجبەکانە تاوەکو شتی هەڵە نەلکێنرێت بە شەریعەت لە بیری خەڵکی و وا گومان ببەن کەوا لە ئاینە و دوای کەون، لەبەر ئەوەیە کەوا زانستێکی گەورە و دیار سەری هەڵدا ناوی لێنرا زانستی ((جرح و تعدیل)) واتە بریندارکردن و ڕاستکردنەوە، لە هەرە سەربەرزیەکانی ئەم نەتەوە بوو، بە هۆی ئەوەوە سوننە پارێزرا، و بەهۆیەوە دروستی لە لاوازی فەرموودەکان جیا کراوە.

وە زانستی ((جرح و تعدیل)) یەکێکە لە زانستەکانی فەرموودە، و بابەتەکانی لە حاڵی ئەو کەسە دەگەڕێت کەوا فەرموودەیەکی گێڕاوەتەوە -زانستەکەی گواستۆتەوە- لە ڕاستی و دروستی و ڕاستگۆی و ئەمانەتی، باسی گێڕەرەوەیان دەکرد لەوەی کە تێیدایە لە بریندارکردن وەکو لاوازی یان درۆ، یان ئەندێشە کردن.

بەڵکو زانایان ئەو بریندارانەیان پۆڵێن کردوە هەروەکو بوخاری لە کیتابەکەی بە ناوی ((الضعفاء)) و بەهەمان ناوەوە ابو جعفر العقيلي (کۆچ کردوی: 322 ک) دایناوە، وە نەسائی خاوەنی سونەن (کۆچ کردوی: 303ک) پەرتوکێکی داناوە ابن جوزی(کۆچ کردوی: 597 ک) دایان ناوە، بەناوی ((الضعفاء والمتروكون))، بەهەمان ناوە دار قطنی (کۆچ کردوی: 385ک)، و ابن جوزی (کۆچ کردوی: 597ک) دایان ناوە، وە ابن عدي الجرجاني (کۆچ کردوی: 365ک) دای ناوە بەناوی ((الكامل في الضعفاء الرجال))، وە جگە لەوانەش لە زاناکان لەو بوارە دانراوی بەناوبانگ و گرنگیان هەیە، عبدالله کوڕی پێشەوا احمد بن حنبل، الله ڕەحمیان پێ بکات دەڵێ (ابو تراب النخشبي هات بۆ لای باوکم، باوکم دەیوت فلان لاوازە، و فلان جێی متمانەیە، ابو تراب وتی: ئەی شێخ غەیبەتی زانایان مەکە! باوکم ڕوی سوڕاند بۆی و وتی: هاوار بەماڵت ئەوە

ئامۆژگاریە، غەیبەت نیە)) [تاریخ بغداد]. وە ابن جوزی لە محمد کوڕی دیناری جورجانی باسی کردوە دەڵێ: ((بە احمدی کوڕی حەنبەلم وت قورسە لەسەرم بڵێم کەوا فڵان لاوازە و فڵان درۆزنە; وتی: ئەگەر تۆ بێدەنگ بووی و منیش بێدەنگ بوم، چۆن کەسی نەشارەزا دروستی لە نەخۆشی جیا بکاتەوە؟)) [الضعفاء والمتروكون].

ئەگەر ئەوە ڕێبازی پێشەواکان بێت لەوەی کەوا (هەڵە دەکات یان ئەندێشە دەکات -لە گێڕانەوە- لە ئەهلی چاکە و ڕاستی باسی هەڵەکەی بکەن بۆ ئاگادارکردنەوەی خەڵکی لە هەڵەکەی، ئەوە ڕێبازیان لەگەڵ ئەهلی بیدعە و ئارەزوو توند تر و گەورەترە، لە ئاگادارکردنەوە و دورکەوتنەوە لێی هەروەکو پێشتر باسکرا، هەرچی خاوەنی بیدعەی کوفریە ئەوە پێشەواکان بۆیان هاتونەتە دەست بە وەڵامدانەوە و لێدان و ئاگادار کردنەوە، و هەجر کردن و ناوزڕاندن و تەکفیریان کردوون، ئەوە ((بشری مریسی)) گومڕایە کەوا دەیوت قورئان دروستکراوە، وەبێباوەڕ بوو بە ناوەکانی الله، نکوڵی دەکرد لە هەندێکیان، پێشەوایانی سوننە سەرکۆنەیان کرد، و خەڵکیان ئاگادار کردەوە لێی، وە پەرتوکیان دانا بە وەڵامدانەوەی بەناوی خۆی، هەروەکو پێشەوا ابو سعید دارەمی لە پەرتوکەکەی بەناوی: ((نقض عثمان بن سعيد، على بشر المريسي الجهمي العنيد فيما افترى على الله في التوحيد))، بەڵکو کافریان کرد گەیاندیان بە پێشینەی خۆی جەهمی کوڕی صەفوان، حمادی کوڕی زەید کاتێك پرسیاری بشری مریسي لێدەکرێت دەڵێت: ((ئەوە کافرە)) [الدارمي: النقض على المريسي]، وە عبداللطیف آل شیخ، ڕەحمەتی الله لێ بێت دەڵێت: ((ئەهلی زانست ڕێککەوتوون لەسەر کافربوونی)) [مجموعة الرسائل].

ئەوە مریسیە کەوا لەلای چەندین زانا داوای زانستی کردوە لە سەردەمی خۆی لە فەقیهەکانی سەردەمی خۆی بوو، وە گوێی لەوان بووە دانیشتوە لەگەڵیان، بەوە نەبوە بە زیرەکەکان، بەڵکو ذەهەبی لە باسی ژیانی دا دەڵێت ((لە کەلامیەکان بوو، مناظر بوە، زیرەك بووە [بشر المريسي]... بشر لە گەورە فەقیهەکان بوو; زانستی وەرگرتوە لە قازی ابو یوسف، و فەرموودەی گێڕاوەتەوە لە حمادی کوڕی سلمە، و سفیانی کوڕی عیینة; سەیری زانستی کەلامی کرد و زانستەکە زاڵ بو بەسەری، دورکەوتەوە لە وەرع و تەقوا، وە دەیوت قورئان دروستکراوە، وە بانگەوازی بۆدەکرد، تاوەکو ببو بە چاو و زانای جەهمیەکان لەسەردەمی خۆی)) [السير].

بەڵکو پێشەواکانی سوننە دەبینین کەوا ڕانەوەستاون لە تەکفیرکردنی جەهمیەکان و سەری جەهمیەکان مریسي و ئاگادارکردنەوە لێیان، بەڵکو هانی خەڵکیان داوە کەوا سەرەکانیان بکوژرێن، ئەوە پێشەوا یەزیدی کوڕی هارونە -ڕەحمەتی الله لێبێت- دەڵێت: ((جەهمیەکان کافرن، زیاتر لە جارێك خەڵکی بەغدادم هانداوە بۆ کوشتنی مریسي)) [الدارمي: الرد على الجهمية].

ئەوە پێشەوای باوەڕداران هارونە ڕەشیدە دەڵێت: ((پێم گەیشتوە کەوا بشری مریسي دەڵێت کەوا قورئان دروست کراوە، والله ئەگەر دەستم پێی گەیشتبا دەبایە کوشتنێك بمکوشتبا کە کەس بەم شێوە نەکوژرابێت)) [عبدالله بن احمد: السنة].

وە بەدرێژای مێژوو ڕوداوی کافرکردن و کوشتن و لە خاچ دانی زۆر لە زەندیقەکانی تێدایە، لەگەڵ سەرەکانی بیدعە و زیادەڕەوەکان، وەکو کوشتنی جعدی کوڕی درهەم، و جەهمی کوڕی صەفوان، و حسین کوڕی منصور الحلاج، وە پێشەواکانی ناسراو لەسەر ئەو ڕێبازە ڕۆیشتون لە مامەڵە کردن لەگەڵ پێشەوای گومڕا و زەندیقەکان، دەبینین کەوا ابو عەباس ابن تیمیە -ڕەحمەتی الله ی لێبێت- کەوا قسە لەسەر ابن عەرەبی زەندیقی حلولی دەکات بە دیاریکراوی، وە پەرتوکی ((منهاج السنة)) دەنوسێت لەوەڵامدانەوەی سەری ڕافیزە ابو منصور الحلي، وە هەروەها چەند پەیامێك دەنوسێت بۆ وەڵامدانەوەی گۆڕپەرست البكري المصري و جگە لەوانەش لە بانگەشەکەرانی گومڕایی.

بەهەمان شێوە دەبینین کەوا ئەم ڕێبازە جوان دیارە لای پێشەوا محمدی کوڕی عبدالوهاب -ڕەحمەتی الله ی لێبێت- و قوتابیەکانی لە زانا ڕاستگۆکان، هیچ بۆنەیەکیان جێنەهێشتوە ئیلا ئابڕوی زەندیقەکان و بانگەوازکەرانی شیرك، و بەرگری کەرانی موشریك، و ئەوانەی درۆ دەکەن لەسەر ئەهلی تەوحیدیان بردوە، نمونە ابن عفالق، و ابن فیروز، و مناڵەکانی مویس، و ابن جرجیس و جگە لەوانەش، بەڵکو پەرتوکیان داناوە بەتەواوی، جگە لە پەیامی تایبەتی، وە فتوای زۆر.

قسە کردن لەسەر بیدعەچیەکان و زەندیقەکان و ئابڕو بردنیان بە ناوەکانیانەوە و حوکم دان لەسەریان لەلایەن ئەو کەسانە ئەهلن بۆ ئەم کارە ڕێبازێکی ڕەسەنە لای ئەهلی سوننە و جەماعە، وە لە ئەوە نزیکترە کەوا ئەوە پەیڕەوی بکەین لە ڕێبازەکەیان لەسەر تاغوتان و جەهمیەکانی سەردەم کەوا خەڵك ڕادەکێشن بەرەو شیرك و کوفر -دواتر بۆ ئاگری دۆزەخ- بە بازاڕ دان بە گومڕایی، و شاردنەوەی ڕاستی، و گۆڕینیان لەسەر خەڵکی، داوا لە الله دەکەین کەوا یارمەتیمان بدات لەسەر ئابڕو بردنیان و ڕونکردنەوەی حاڵیان بۆ خەڵکی.

شەهید بوونی شێخی موجاهید

# ئەبو موحەممەدی فورقان

ئەمیری دیوانی ناوەندی ڕاگەیاندن

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله رب العالمين والصلاة والسلام على نبينا محمد ، وعلى آله وصحبه أجمعين ، أما بعد:

الله تعالى دەفەرمووێت: (وا دامەنێن ئەوانەی کوژراون لە ڕێی الله مردون بەڵکو زیندوون ڕۆزیان پێدەدرێت لای پەرستراویان ، دڵخۆشن بەو فەزڵانەی کە بۆیان هاتوە لەلایەن الله وە مزگێنی دەدەن بەوانەی کەوا پێیان نەگەیشتون کەوا نەترسن و دڵتەنگ نەبن، مزگێنی دەدەن بە بەخشش و فەزڵ لە لایەن الله وە الله پاداشتی موسڵمانان ون ناکات) (آل عمران: 169-171).

لەڕێی الله، و بەرزکردنەوی وشەی تەوحید، وە تەواوکردنی ڕاگەیاندنی خیلافەت، سوارچاکی نەبەرد و سەرکردەی خۆڕاگر شێخی بەڕێز (ابو محمدی فورقان) گەڕاوە بۆ لای الله، دوای چەندین ساڵ لە بەخشین و کاری بەردەوام و تووڕەکردنی کافران و ئەهلەکەی، وە دوای جەنگێکی قورس کە ڕاگەیاندن لە هەرە دیارەکان بوو لە گۆڕەپان، خەوی کافرانی زڕاند و ماڵەکانی بە فیڕۆدان و وای کرد کەوا پەشیمانی دڵەکانیان بخوا، دوای بێهیوابوونیان لەو ڕاگەیاندنە کەوا -بە فەزڵی الله- توندە و سست نابێت بە ئاگر و درۆی کافران.

وە بەڕاستی شێخ -هەروەکو ئاوای دادەنێین الله ش خۆی حەسیبە- پێشەوا بوو لە زانست و دانایی، بیرۆکەکانی دەیان پێکا، شارەزا بوو چۆن کافران تووڕەبکات، موخڵیصێکی نادیار بوو، الله پاڵپشتی کردبوو بۆ دورخستنەوەی فێڵی پوچ و زوڕنای شەیتان و ڕاگەیاندنە درۆزنەکەی.

مزگێنی دەدەین بە نەتەوەی خاچ پەرست و کلکەکانیان کەوا ڕۆژەکان دووگیانن کەوا دڵەکان پارچە دەبن لە ترسی، وە خوێنی شێخ - الله لێی وەرگرتبێت- و ئەوانەی پێشە خۆی لە براکانی هیچ نیە تەنها ڕوناکی ڕێنمونی کەرە بۆ دوای خۆیان، بۆ ئەوەی لەبەر ئەو ڕوناکیە بڕۆن و ئەو ئاڵایە بدەن بەوانەی دوای خۆیان، الله زاڵە بەسەر کارەکانی بەڵام زۆربەی خەڵکی نایزانن، والحمد لله رب العالمين.

النبأ

# جیهاد

## بـه دوعـاکـردن

پاڕانەوە (دعاء) چەکێکی بەهێزی ڕابردووی کوشندەیە کارەساتەکان ئاشکرا دەکات و ڕێگری لە ناوچوون دەکات، وە باوەڕدار بەهۆیەوە تاقیکردنەوەکان دەبڕێت و بەرگری دەکات لە فێڵی دوژمنانی، وە بەهۆیەوە بەخششەکان بەدەست دەهێنێت و ناخۆشیەکان بەلاوە دەنێت، بەهۆیەوە پەژارە و ناخۆشیەکان لادەبات، وە پاڕانەوە لە تایبەترینی عیبادەتەکانە، بەڵکو دوعا خۆی عیبادەتە کەوا تەواوی خۆشەویستی و تەواوی ملکەچ بوونی تێدایە، بۆ الله ی تاك و حەکەم و عەدل، تیایدا بەندە موناجاتی پەرستراوی دەکات، وە دان بە بێتواناى خۆی دەنێت، لابەری ناخۆشی و تیماری دڵە و چارەسەری برینەکان و ئاسانکاری کارەکانە، ئەوەی توانای دوعای نەبوو بێتوانایە، ئەوە عیبادەتێکی ئاسانە، ئاسانە لە شەو و ڕۆژ دەبەخشرێت لە وشکانی و لە دەریا ڕێگە پێدراوە لە کاتی گەشت و لەکاتی ئاسایی، نزاکاران ڕادەکەن بۆ لای ڕەحیم و ڕەحمانی زانا، وە پەیوەست دەبن بەوەی کە مەلیك و قودوس و سەلام، وە لە کاتی دوعادا خۆی دەبینێت کەوا دانیشتوە لە نێوان دەستەکانی بەڕێزی بەڕێزەکان، پەیوەندیەکانیان دەپچڕێنن بە جیهان و ڕودەکەن پەرستراوی جیهانیان، ڕزگار دەبن لە پێویست بوون بە خەڵکی و منەتەکانیان، و یەکلا دەبنەوە بۆ داواکردن لە پەرستراویان، چاویان لە فەزڵی ئەوە لەسەریان...

ئەوە دوعایە، موسڵمانان زۆر پێویستیان پێیەتی لەو ڕۆژانە کەوا هەرچی نەتەوەی کوفر هەیە کۆبونەتەوە لەسەر کۆمەڵی موسڵمانان! با موجاهیدی ڕێی الله ئاگادار بێت لە گرنگی ئەو چەکە و پێداویستیەکانی گرنگی پێدان و پێ واجب بوونی و واز هێنان لە پەیوەست بوون بە جگە لە سەمیع و موجیب، هەروەکو پێویستە هەموو موسڵمانێکی نێر و مێ بەشدار بێت لە بەکارهێنانی ئەو چەکە دژی دوژمنانی الله کەوا چەکێکی سەرکەوتووە، صلى الله عليه وسلم دەفەرمووێت (جیهادی موشریکەکان بکەن بە ماڵ وبەگیان و زمان) [أبو داود و النسائي گێڕاویانەتەوە]، جیهاد کورت نابێتەوە لە زمان بۆ هاندان بۆ جیهاد و پیاهەڵدانی موجاهیدان و زەم کردنی دانیشتوان لە جیهاد و هێرشی کافران؛ بەڵکو لە گرنگترین جۆرەکانی جیهاد جیهادی زمانە: دوعا، بەوەی کەوا موسڵمان دوعا بکات بۆ دۆڕانی موشریکان و سەرخستنی باوەڕداران.

ئەم جۆرە جیهادە زۆر دوپات دەکرێتەوە (جیهاد بە دوعا) بۆ ئەوانەی کەوا الله جەنگ کردنی لە پێناو خۆی بۆ ئاسان



